## بنه‌ما شه‌رعی‌یه‌کان و هێڵه‌ گشتی‌یه‌کانی

# کۆمه‌ڵێکی ئیسلامی ڕه‌سه‌ن

عه‌لی باپیر



چاپی یه‌که‌م

١٤٢٢ك – ٢٠٠١ ز

## بنەما شەرعی یەکان و هێڵە گشتی یەکانی

# کۆمەڵێکی ئیسلامی ڕەسەن

عەلی باپیر



چاپی یەکەم

١٤٢٢ك- ٢٠٠١ز

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پێشكەشە

به ئەندامە موجاهیدو دڵسۆزو

پێشمەرگە فیداكارو بەپەرۆشەكانی

بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامیی،

بەهیوای بەرچاورِوونی زیاترو چاكتریان.

# پێشەکی

بێگومان ئەسڵ لەبوون (وجود)ی مسوڵمانان دا کۆمەڵ بوون (تجمّع) و یەکبوون (وحدة) و یەکگرتنیانەو، ئیسلام ئایین و بەرنامەیەکە چەندە پەیوەندی بەتاک (فرد)ەوە هەیە، چەند قات (أضعاف)ی ئەوە پەیوەندی بەکۆمەڵ (جماعة) ەوە هەیە، چونکە ئەگەر چەند ئەرک و فەرمانێکی بەتاکیی (فَرديّ)ی ئەنجام بدرێن، ئەوە بێگومان زۆربەی هەرەزۆری ئەرک و فەرمانەکانی بەکۆمەڵ و کاری هەرەوەزیی نەبێ جێبەجێ ناکرێن، ئەمانەش چەند ڕاستی‌یەکی ڕوون و بێ چەندو چوونن کە لەسەدان ئایەتی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ داکۆکیی‌یان لەسەر کراوە.

بەڵام بێگومان ئەگەر بێت و کۆمەڵ بوون و یەکبوون و یەکگرتنی مسوڵمانان بەو شێوەیەو چۆنیەتی‌یە ڕاست و شەرعی‌یە نەبێ کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دیاری‌یان کردوەو فەرمانیان پێ‌کردوەو، لەسەر ئەو بنەما شەرعی‌یانە (الأصول الشرعية) بنیات نەنرێ و، بەپێی ئەو بنچینەو یاسا شەرعی‌یانە (القواعد والأحكام الشرعية) بەڕێوەنەبرێ کە لە قورئان و سوننەت دا خراونەڕوو، ئەوە نەک هەر ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە مەبەستە شەرعی‌یەکان (المقاصد الشرعية)ی پێ‌ناهێنرێنەدی، بگرە بەئەندازەی ڕەچاونەکردنی بنەماو بنچینەو یاسا شەرعی‌یەکان و لێ‌لادانیان، شەرعیی بوون (شرعية)ی خۆیشی دەخاتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە!

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەم قۆناغ و هەل‌ومەرجەی ئێستامان دا سەرجەم براو خوشکانی دڵسۆزو بەپەرۆشی نێو بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی‌مان بەهۆی لادان (إنحراف)ی بزووتنەوە - بەتایبەت لەئاستی قیادەدا - لەزۆربەی بنەماو بنچینە شەرعی‌یەکان، دووچاری دڵساردیی و نائومێدیی و بێزاریی بوونەو هەر چاوەڕێی دۆزینەوەی ڕێچارە (طريق حلّ)ێکن، بەپێویستم زانی کە لەدوو توێی ئەم چەند لاپەڕەیەدا تیشک بخەمە سەر ئەو بنەما شەرعیی و هێڵە گشتی‌یانەی کە دەبێ کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی ڕاست و ڕەسەن لەسەریان بنیات [illegible] کە هەموو ئەو

ئەندامو موجاهیدە بەڕێزو دڵسۆزانەی کە چاوەڕوانی ڕاست کردنەوەو گۆڕانکاریی‌یەکانی ڕیشەیی کۆمەڵو بزووتنەوەی ئیسلامیی‌یەکەیانن، تێکڕاو وێکڕاو بوێرانەو دەست گەرمانە لەسەر بناغەی ئەم بنەما شەرعی‌یانەو، لەبەر ڕۆشنایی ئەم هێڵە گشتی‌یانەدا دەستبار بۆ یەکتر بگرنو، بەر لە داڕووخانو پووکانەوەی زیاتری بزوتنەوەکەیان بگرنو، بەهاندەری خوا لەخۆڕازی‌کردنو بەندایەتی (عبودیة)ی چاك بۆ خواکردن، بێ‌گوێ‌دانە لۆمەو سەرکۆنەی خەڵکی، شەرعی‌یەتو ڕەسەنایەتی‌یەکی تێرو تەواو بۆ کارو کاروانە جیهادی‌یەکەیان بگێڕنەوە، وەك خوای بەخشندە لەبارەی مسوڵمانانی هەڵبژاردەی بووژێنەرەوەی ئایینەکەیەوە فەرموویەتی: (...يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ولا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ...) المائدة: ٥٤.

ئاشکراشە کە تاکە دەستەبەرکەر (ضامن) ی سەرکەوتنی کۆمەڵی مسوڵمانو ڕێ بۆ تەخت کرانی و یاریدە درانی لەلایەن خوای زاڵو کاربەجێوە، پابەندیی‌یانە بە بەرنامەو شەریعەتی خواوە، کە لەئیمانو عەقیدەی ڕاستو ساغو چاك بەندایەتی کردنیان بۆ خوادا دەدرەوشێتەوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (وَلا تَهِنُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأنْتُمُ الْأعْلَوْنَ إنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ) آل عمران: ١٣٩،

وە فەرموویەتی: (... إنْ تَنصروا الله ينصركم ويُثَبِّتْ أقدامكُمْ..) القتال: ٧،

وە فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ) العنكبوت: ٦٩.

کۆتایی ئەم چەند قسەیەش بەم ئایەتە بەهێزو پیرۆزەی خوای باڵا دەست دێنم کە فەرموویەتی: (وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ) التوبة: ١٠٥،

برای دڵسۆزتان/ علی باپیر

٢٤ صفر- ١٤٢٢ بەرامبەر ٢٠٠١/٥/١٧

ئەحمەدئاوا

**یەکەم:** تێگەیشتنێکی ڕاست‌و دروست (فهم صحیح وسلیم)ی ئیسلام - کە لەقورئان‌و سوننەت دا بەرجەستەیە -، لەبەر ڕۆشنایی تێگەیشتن‌و زانست‌و ئەزموونی زاناو پێشەوا پێشینە چاکەکانمان دا بەگشتی‌و بەتایبەت هی سێ سەدە شایەدیی چاك بۆ دراوەکان: **(خير الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم..)**[1]،

کە بریتیە لە: { تەنها ئیسلام بە بەرنامە (دین) ی ڕاست‌و تێروتەواو زانینی ژیانی ئینسان، بەتاك‌و کۆمەڵ‌و کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە }، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (...الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا..) المائدة: ٣، وە فەرموویەتی: (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) آل عمران: ٨٥.

**دووەم:** فێرکردن‌و پەروەردەو تەزکیەکردنی سەرجەم ئەندامان بەوردو درشت‌و قاعیدەو قیادەوە لەسەر بناغەی: تێگەیشتنی تەواو ئیمان‌و عەقیدەی ڕاست (العقيدة الصحيحة)‌و خواپەرستیی ساغ‌و ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسەند، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (...يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ..) الجمعة: ٢.

**سێیەم:** پابەندیی (التزام) ی هەموو لایەك قیادە پێش قاعیدە، بەشەرعەوە کە مەبەستمان پێی دەقەکانی قورئان‌و سوننەت‌و ئەو بنچینە (قاعدة) و یاسا (حکم) شەرعی‌یانەیە کەلەلایەن زاناو پێشەوایانی ڕەسەنەوە هەڵهێنجراون، وە گێڕانەوەی هەر مەسەلەو بابەتێکی مشت‌ومڕ هەڵگر بۆ تەرازووی قورئان‌و سوننەت‌و ساغکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیانە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء: ٥٩.

---

[1] متفق عليه عن ابن مسعود رضي الله عنه، بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الالباس...) ج١ص٤٧٥.

**چـوارەم:** توندوتۆڵیی قیـادەو سەرپەرشتیکردن و مشـوورخواردنی بـۆ تێکڕای ئۆرگانەکان و ئەندامەکانی کۆمەڵ و دادگەریی چەسپاندن و بە پەرۆش و بـە تەنگـەوەبوونی بـۆ چارەسـەریی کێشـەو گرفتـەکانیان و دابـین کردنـی بەرژەوەندیـیـە مەعنـەویی و ماددیـیـەکانیان و، پابـەندبوونی هـەرچی زیـاترو چاکـتری بـە بنچینـەی ڕاوێژکـردن (قـاعدة المشـاورة)ەوە بەهـەردوك جـۆری (الشوری) و (المشورة) ەوە، بەپابەندکەر (مُلْزِمْ) دانانی ئەنجامەکانیان و،[2] وە کەڵکی خـراپ وەرنـەگرتن (عـدم آسـتغلال)ی هیـچ بەرپرسـێك لـە پلـەو پایـەو کارەکەی بۆ بەرژەوەندیە شەخصی و بنەماڵەیی و خزمایەتی و.. هتدەکان و، بە سینەی فراوان و ڕەوشتی جوانەوە گوێگرتن بۆ پێشنیارو ڕەخنەو قسەی هەر کەسێك و بەئەمیەت و بایەخ پێدانەوە وەرگرتنیان و هەڵسەنگاندنیان.

وە نەچوونەدەر لەبازنەی ئەو مەرجانە (شـروط)ی کە ئەو کۆمەڵە لەسەریان پێکهاتوە واتە: بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆ (المنهج والنظام الداخلي)ی.

وە لێپرسـینەوەو سـزادانی سـەرپێچیکەران و لادەران و، تـەقدیر کـردن و پاداشت دانەوەی چاکەکاران.

خوای باڵا دەست و دادگەر فەرموویەتی: (..فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّـهِ لِنـتَ لَهُـمْ وَلَـوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِـي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ) آل عمران: ١٥٩.

هەروەها فەرموویەتی: (..فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَـاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا..) المائدة: ٤٨.

---

[2] (شوریٰ) ڕاوێژکردنی قیادەیە بە قاعیدە لەمەسەلەو بابەتە گشتییەکان دا کەڕای زۆربە هەڵیان دەبڕێ و (حَسْم) یان دەکات، کە دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەشاری مەدینە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن لەجەنگی ئوحود دا لەسەر ڕای زۆربەی هاوەڵان، لەم جۆرەیە، (مشـورة)یـش یـەکلایی کردنەوەی مەسەلە (اجتهادي)یەکانە لەبەر ڕۆشنایی بیروڕای پسپۆڕان (متخصّصين)دا، کە مـەنزڵگا گواسـتنەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەجـەنگی بـەدرداو لەسـەر پێشـنیاری (حبّاب بن مُنْذِر)یش خوالێیڕازیبێ نموونەیەکە لەم جۆرە ڕاوێژکردنە.

هەروەها فەرموویەتی: (فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ...) الشورى: ١٥.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **(المسلمون عند شروطِهم..)** رواه ابوداود واحمد والدارقطني عن ابي هريرة رضي الله عنه وصححه لحاكم، وقد علقه البخاري جازماً به في الإجازة.[٢]

هەروەها فەرموویەتی: **(كلكم راعٍ وكلكم مسئول عن رعيته)** متفق عليه عن ابن عمر رضي الله عنه.

<u>**پێنجەم**</u>: پابەندیی سەرجەم ئەندامان بەفەرمان و ئاراستەکردنی سەرووی خۆیانەوەو گوێ گرتن و بەقسەکردن (السمع والطاعة)یان لەسنووری شەرع داو بەپێی توانا، وە خستنەڕووی دڵسۆزیی و حورمەت و ڕێزیان بۆ قیادە، وە قسەی هەق گوتن (قول الحق) و خستنەڕووی پێشنیارو ڕەخنەکانیان لەچوغزی ئادابە شەرعی‌یەکاندا.

وەك خوای زانا فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ..) النساء: ٥٩.

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: **(على المرءِ المسلم السَّمْعُ والطاعة فيما أحبَّ وكره الا أن يؤمر بمعصيةٍ فاذا أُمِرَ بمَعْصيةٍ فلا سَمْعَ ولا طاعة)** متفق عليه عن ابن عمر رضي الله عنهما.

هەروەها فەرموویەتی: **(الدين النصيحة، قلنا لِمَنْ؟! قال لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامَّتهم)** رواه مسلم عن تميم بن اوس الداري رضي الله عنه.

هەروەها فەرموویەتی: **(أفْضَلُ الجهاد كلمة حقٍ عند سلطان جائرٍ)** رواه ابوداود وابن ماجة عن ابي سعيد الخُدري رضي الله عنه..

---

[٢] بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الالباس..) ج٢ص٢٧٣.

**شەشەم:** خۆشەویستی و ڕێزو حورمەت و وەفای دووسەرە (المتبادل) لەنێوان سەرجەم ئەندامان دا بەگشتی و قیادەو قاعیدە بەتایبەت، وە داخستنی دەرگای غەیبەت و قسە هێنان و بردن و تانە لێدان و زەم کردن و.. هتد، وە دڵ ساغ (سلیم) بوون و دەم و دەست سەلامەت بوون لەگەڵ یەکتر، وە خۆپاراستن لەهەر جۆرە دەمارگیریی (تَعَصُّب)یەك بۆ دەستەو تاقم و ناوچەو شارو تیرەو عەشرەت و... هتد.

چونکە خوای کاربەجێ و دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ التوبة: ٧١.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (والذي نفسي بيده لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا ولاتؤمنوا حتى تحابّوا..) رواه أحمد ومسلم وأبوداود و الترمذي عن ابن مسعود رضي الله عنه.

هەروەها فەرموویەتی: (لاتباغضوا ولاتحاسدوا ولاتدابروا ولاتقاطعوا وكونوا عبادالله إخواناً ولايحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثٍ) متفق عليه عن انسٍ رضي الله عنه.

**حەوتەم:** بەهیچ شێوەیەك دانەبەزین (عدم التنازل)و دەست بەرنەدانەبوونی ئەو بنەماو مەبدەئە شەرعیانە (الثوابت والأصول الشرعية)ی کە وازلێهێنانیان سەردەکێشێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی بناغەی لەسەر وەستانی کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامییەکەو شەرعییەت پێوەنەمانی و پووچەڵ بوونی، بۆ وێنە: دۆستایەتی گرتن (موالاة) و پشتگیریکردن و پشت پێبەستنی ئەهلی کوفرو شیرك و نیفاق، کە پێچەوانەی ئەسڵی گەورەو گرنگی: دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکردن لەبەر خوا (الموالاة والمعاداة في الله)یە!

بەڵام دەبێ زۆر وریا بین و پێکەوە مەدار کردن و ساچاندن (المُداراة)ی کۆمەڵی ئیسلامیی لەگەڵ دەوروبەریدا بەبێ نەرم کێشان (المداهنة)و واز لە (مبادیء)و سیاسەت و ستراتیژی خۆهێنان، کە بێگومان بۆ هەر کارو

جموجوڵێکی سیاسی‌یانه پێویسته، له‌گه‌ڵ لێ‌دابه‌زین (تنازل) ی بنه‌ما شه‌رعی‌یه‌کان تێکه‌ڵ نه‌که‌ین، چونکه (تنازل) و (مداهنة) هه‌میشه حه‌رامن، به‌ڵام مه‌دارکردن (مداراة) دروست (جائز)و بگره جاری وایه فه‌رزیش ده‌بێت، مادام ئامانج و مه‌به‌ستێکی شه‌رعی په‌کی له‌سه‌ری بکه‌وێ، فه‌رمووده‌که‌ی پێغه‌مبه‌ریش ﷺ (.. إئذنوا له وبئس أخو العشيرة) که (بخاري) له (عائشة) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویه‌ته‌وه چاکترین به‌ڵگه‌یه له‌وبار‌ه‌وه، که هه‌رچه‌نده پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌و کابرایه‌ی به‌خراپترین که‌سی ئه‌و تیره‌یه‌ی زانیوه، کاتێك هاتۆته لای ڕێزی گرتوه‌و قسه‌ی نه‌رمی له‌گه‌ڵ کردوه !

خوای تۆڵه‌سێن و بالا ده‌ست فه‌رموویه‌تی: (وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا، إِذًا لَأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا) الإسراء: ٧٤- ٧٥،

هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی: (تَرَى كَثِيرًا مِنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنْفُسُهُمْ أَنْ سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ، وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ) المائدة: ٨٠-٨١.

**هه‌شته‌م:** هه‌ڵپه نه‌کردن بۆ پله‌و پایه‌و به‌رپرسیارێتی‌و داوا نه‌کردنی و سوور نه‌بوون له‌سه‌ر تێدا مانه‌وه‌ی، چونکه، ئه‌م ڕه‌فتارانه له‌ئه‌سڵ دا قه‌ده‌غه و ناپه‌سه‌ندن، وه‌ك خوای په‌روه‌ردگار فه‌رموویه‌تی[4]: (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) القصص: ٨٣.

پێغه‌مبه‌ریش ﷺ فه‌رموویه‌تی: (إنّا والله لانُولّي هذا العمَل أحداً سالَهُ أو أحداً حَرَصَ عليه) متفق عليه عن ابي موسى الأشعري رضي الله عنه.

وه پێویسته هه‌رکه‌سێك به‌زه‌قی ئه‌و حاڵه‌تانه‌ی لێ‌ببینران ئه‌رکی به‌رپه‌رسێتی پێ‌نه‌سپێرری.

---

[4] (نووي) ئه‌م ئایه‌ته‌ی له (رياض الصالحين)ه‌که‌ی‌دا و له‌ژێر سه‌ریاسی: (باب النهي عن سؤال الإمارة واختيار ترك الولايات اذا لم يتعين عليه او تدعُ حاجة اليه)، بڕوانه: ص ٢٤٠، دا هێناوه.

**نۆیەم:** تەنها پشت بەخوابەستن و لەسەر پێی خۆوەستان لەڕووی ئابوورییەوەو پاراستنی سەربەخۆیی فیکریی و سیاسیی خۆ، ڕەدکردنەوەی هەرجۆرە وابەستەییەك، چونکە بەبێ پشت بەخوابەستن (تَوَكّل) و لەسەر پێی خۆ وەستان (الأعتماد على الذات) و سەربەخۆیی (إستقلال)ی خۆپاراستن، کۆمەڵی ئیسلامیی ناتوانێ و ڕێی نادرێ ئامانجە شەرعی یەکان بێنێتەدی.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنْ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) الانفال: ٦٤، هەروەها فەرموویەتی: (إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا...) المائدة: ٥٥.

وە دەربارەی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەوەسفیان دا فەرموویەتی: (..مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ..) الفتح:٢٩.

**دەیەم:** کارو ئەرك بەخەڵکی سپاردن لەسەر بناغەی تواناو دەستپاکیی (القوة والأمانة) و شایستەیی (الكفاءة)و ڕەچاو نەکردنی هیچ مەسەلەیەکی دیکەی وەك خزمایەتی و ناوچەگەرێتی.

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: (وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ) السجدة: ٢٤.

وە لەسەر زمانی یەکێك لەدوو کچەکانی پیاوە صاڵحەکە - کەزۆر لەزانایان پێیان وایە (شُعَیبْ)ە عليه الصلاة والسلام - فەرموویەتی: (..يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنْ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ) القصص: ٢٦.

**یازدەیەم:** کاروبار بەڕێوەبردن بەشێوەی دابەش کردنی کاری ئەرکەکان بەسەر کەسانی پسپۆڕو شارەزاو دروست کردنی سیستەمی دامەزراوەکان (نظام المؤسسات) و دەست تێوەرنەدانی هیچ کەس و ئۆرگانێك لەکاروباری ئەوی تر مەگەر لەسەر بنچینەی هاوکاریکردنی یەکتر.

خوای بەرزو مەزنیش فەرموویەتی: (قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ) الأسراء:٨٤.

وە فەرموویەتی: (...وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ..) المائدة: ٢.

**دوازدەیەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە خۆی بەکۆمەڵێکەمسوڵمانان و هۆکار (وسیلة)ێك لەهۆکارەکانی خزمەتی ئیسلام دادەنێ و نە پێی وایە مسوڵمانانی تێدا کورت هەڵهاتوون و نە حەق و ڕاستیشی لەسەر تاپۆکراوە، چاکیی و خراپیشی پەیوەستە بە ڕادەی دینداریی و پابەندیی بەشەرعی خواوە، یان لێ‌لادانی.

خوای بەخشندەش فەرموویەتی: (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) فصلت: ٣٣.

**سێزدەیەم:** ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی‌یە لەسەر خۆی بەپێویست دەزانێ کە ئەرکی برایەتی بەرانبەر بەسەرجەم مسوڵمانان-بەپێی توانا- ئەنجام بدات و، بۆ هێنانەدی ئامانجە شەرعی‌یەکان هاوکاری‌یان بکات، بەهەموو چین و توێژو کۆمەڵ و تەوژم و کەسایەتی‌یەکانیانەوە، مادامەکە لەسەر بناغەی ئیمان و عەقیدەو لەبازنەی ئیسلام دا لەگەڵی یەك بگرنەوە.

وە هەوڵیش دەدات کە هەم لەئامۆژگاریی و پێشنیاو ڕەخنەکانیان بەهرەمەند بێ و هەم بەپێی تواناش ڕێرووونی‌یان بکات و، کەموکورتی‌یەکانیان چارەسەر بکات، وە لەسەر بناغەی خاڵە هاوبەشەکان (النقاط المشتركة) هەڵس وکەوتیان لەگەڵ دەکات و، مەگەر لەکەش و هەوای دۆستانەو زانستیی‌یانەدا ئەگەرنا بەهیچ جۆرێك وردە بابەتە خیلافی‌یەکانیان (مادام لەبازنەی شەرع دا جێیان ببێتەوە) لەگەڵ ناورووژێنێ و لەکاتی مشت ومڕو تێك گیرانیش دا بەڕەوشتی بەرزو جوانی مسوڵمانانەو برایانەولەسەر بناغەی بنچینە (قاعدة)ی (إدْفَعْ بالتي هي أحْسَنُ..) فصلت: ٣٤، هەڵس وکەوتیان لەگەڵ دەکات، چونکە مادام ئەم جۆرە شێوازە لەگەڵ ئەهلی کوفرو شیرك دا پەسەند یان پێویست بێ، ئەوە مسۆگەر لەگەڵ ئەهلی ئیمان و ئیسلامدا پەسەندترو پێویستترە.

خوای بەخشندەو کاربەجێش فەرموویەتی (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) الحجرات: ١٩. هەروەها فەرموویەتی: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ...) التوبة: ٧١.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (**المؤمن للمؤمن كالبُنيانِ يَشدُّ بعضُه بعضا**) رواه مسلم.

**چواردەیەم:** خۆبژارکردنی یەك یەکی ئەندامانی ئەو کۆمەڵە لەخوو و خدە پەستەکان (الرذائل) و خۆڕازاندنەوەیان بەخەسڵەتە بەرزو پەسەندەکان (الفضائل) و، هەڵس وکەوت کردنیان لەگەڵ تێکڕای خەڵکیدا بەپێی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزو جوانەکانی ئیسلام‌و، خۆپاراستن لە هەرجۆرە زیان گەیاندنێك بەخەڵکی بەدڵ‌و زمان‌و ئەندامەکانی دیکەو، کۆشش کردن بۆ سوود و کەڵك پێگەیاندنیان بەدەست‌و زمان‌و ماڵ‌و سامان. چونکە خوای بەخشندەو بەخشەر فەرموویەتی: (خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ) الأعراف: ١٩٩.

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: (**المُسلِم مَنْ سَلِمَ المسلمونَ مِنْ لِسانِهِ ويدِهِ والمهاجر مَنْ هاجَرَ مانَهى‌الله عنه**) متفق عليه عن عبدالله بن عمر بن العاص رضي الله عنهما.

**پازدەیەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە پێشکەش کردنی هەرجۆرە خزمەتگوزاری‌یەك بەخەڵك‌و میللەت لەهەموو بوارەکانی فەرهەنگی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سەربازی‌و .. هتد دا بەخواپەرستی (عبادة) دەزانێ‌و، بەیەکێك لەچاکترین هۆیەکانی لەخوا نیزیك بوونەوەی دادەنێ‌و لەو بوارەدا بەپێی بۆ لووان بەجۆرێك قۆڵی خزمەتگوزاری هەڵدەماڵێ کە هیچ کەس‌و کۆمەڵ‌و لایەنێك نەتوانێ موزایەدەی خەڵك دۆستیی‌و نیشتمانپەروەرێتی‌و خزمەتگوزاریی بەسەردا بکات.

خوای بەرزو مەزنیش فەرموویەتی: (..وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا..) البقرة ٨٣، هەروەها فەرموویەتی: (..وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) البقرة: ١٩٥، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (**الخلق عيالُ الله وأحبهم الى الله انفعهم لعيالِهِ**)°.

---

° بڕوانە: (كشف الخفى ومزيل الألباس..) ج١ص٤٧٢.

**شازدەیەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە لەسەر خۆی بەپێویست دەزانێ کە ئەرکی بانگەوازو فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە (الدعوة والأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر) لەنێو خۆی‌و لەگەڵ دەوروبەری‌دا بەپێی توانا ئەنجام بدات، وە سزاو سنوورە شەرعی‌یەکان بەسەر ئەندامەکانی‌دا و هەرکەسێکی‌تر کە کێشەکەی هێنایە لای دام‌و دەزگا بەرپرسەکانی بەپێی توانا بچەسپێنێ.

هەروەها کاریش دەکات بۆ گۆڕین‌و چاکسازیی‌و پاکسازیی کۆمەڵگا هەتا هەمووی دێتە ژێر سایەو ڕکێفی حوکمی شەریعەتی خواوە لەهەمو لایەن‌و بوارەکانی ژیان‌و گوزەرانی‌دا.

چونکە خوای فەرمانڕەوا فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ آل عمران: ١٠٤.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿..أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ..﴾الشورى: ١٣.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ..﴾ المائدة: ٤٩.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الجاثية: ١٨.

**حەڤدەیەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە چەک‌و هێزی دەستی بەقەڵغانی سەر سەری خۆی‌و پەرژینی کارو جیهادی ئیسلامی‌یانەی دەزانێ‌و، بەپارێزەری پیرۆزی‌یەکان (مقدسات)ی ئیسلام‌و حورمەتەکان (حرمات) ی مسوڵمانان‌و خاک‌و نیشتمان‌و میللەتی دادەنێت و، لەو پێناوەدا بەکاری دێنێت.

خوای زاڵ‌و دادگەریش فەرموویەتی: ﴿..فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ..﴾ البقرە: ١٩٤.

وەفەرموویەتی: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ..﴾ الأنفال: ٣٩.

وەفەرموویەتی: ﴿..وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ البقرة: ٢٥١.

**هەژدەیەم:** ئەو کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامییە پێویستە جەختو داکۆکیی لەسەر هێنانەدی ئامانجە شەرعییە باڵایەکان (تحقیق الأهداف الشرعیة العلیا) لەم قۆناغەی کاری ئیسلامیدا بکاتو، خۆی لە وورده مەسەلەو گیروگرفتە گچکەو لاوەکییەکان بپارێزێو، زیاتر سەرگەرمی پەروەردە کردنی قاعیدەیەکی ئیسلامیی پتەوو دامەزراوو بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵکو میللەت بێت بەڕاستییەکانی ئیسلامو ئامادەکردنو زەمینەسازی بۆ هێنانەکایەی کۆمەڵگاو کیانو قەوارەی ئیسلامیی.

چونکە ناشەرعیەکان (المنکرات) سەرجەمیان زادەو هەڵقوڵاوی ناشەرعیی گەورە (المنکر الأکبر)ن کە بریتیە لە حوکم نەکردن بەشەریعەتی خوا (عدم الحکم بما انزل الله).

خوای زانای پەنهانو ئاشکراش فەرموویەتی: (..وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ) النحل: ٣٦.

هەروەها فەرموویەتی: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) البقرة: ٢٥٦.

شایانی باسیشە کە بەبێ جێبەجێکردنو پیادەکردن (تطبیق)ی شەریعەتی خوا فەرمانڕەوایەتی خوای بەرز (حاکمیة الله تعالی) لەژیانو گوزەرانی خەڵکیدا نایەتەدیو، بەبێ ئەوەش هیچ کام لەدان پێداهێنانی پەروەردگارێتیو پەرستراوێتی خوا (الأقرار بربوبیة الله والوهیته) نایەنە دی، چونکە گەورەترین تایبەتمەندێتی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی بریتیە لەبەرنامە دانانو فەرمانڕەوایەتی: (التشریع والحاکمیة)[٦].

---

[٦] خوای زاڵو و کاربەجێ فەرموویەتی: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ..؟!) الشوری: ٢١، وە فەرموویەتی: (..إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ..) یوسف: ٤٠.

**نۆزدەیەم:** هەرچەندە مەیدانی کارو چالاکی ئێستای ئەو کۆمەڵو[7] بزووتنەوە ئیسلامی‌یە کوردستانە، بەڵام لەسەر بناغەی برایەتی ئیمانیی هەم ئەرك‌و مافی گەلانی مسوڵمان بەگشتی‌و کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکانیان بەتایبەت – بەپێی توانای – لەسەرشانی خۆی دەبینێ‌و، هەم هەقی خۆیشی لەسەر ئەوان بە پێویست دەزانێ.

چونکە: (المسلمون یَدٌ علی مَنْ سِواهُمْ)، وە بێگومان خۆ کوشمەلەکردن (التقوقع) لە جوغزی سنوورە دەستکردەکانی وڵاتانی ئیسلامی‌داو، گوێ بەکێشە و گرفت‌و ئێش‌و ژانی مسوڵمانان نەدان، هەڵەو ناشەرعی‌یە بەتایبەت لەم چاخ‌و ڕۆژگارەدا کە دوژمنانیان یەکدەست‌و یەکدەنگن لە بەرانبەریان دا.

خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا..) آل عمران: ١٠٣.

وە فەرموویەتی: (إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ) الأنبياء: ٩٢.

وە فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ) الصف: ٤.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **(مثل المؤمنین في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مَثَلُ الجَسَد اذا آشتکی منه عُضوٌ تداعی له سائر الجَسَدِ بالسَّهرِ والحُمی)**

متفق علیه عن النعمان بن بشیر رضي الله عنه.

**بیستەم:** لەسۆنگەی ئەوەوە کە بەبێ خاکێکی ئازادو[8] گەل‌و میللەتێکی سەربەخۆو ڕزگار ناگونجێ ئایینی خوا بەرپابکرێ‌و شەریعەتەکەی پیادە بکرێ، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە لەڕوانگەی ئیسلامەوە مافی ڕەوای هەر گەل‌و میللەتێکە کە لە نیشتمانی خۆی‌دا ئازاد بێت‌و لەژێر ڕکێفی

---

[7] واتە ئەو کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامی‌یە کە دەبێ بەگوێرەی ئەو بنەما شەرعی‌یانە بەڕێوەببرێ.

[8] لەکتێبی: (سۆزی ئەوایەتی) دا ئەم مەسەلەیە جوان ڕوون کراوەتەوە، بڕوانە: بەشی چوارەم: (مسوڵمانەتی‌و کوردایەتی..)

دەستەڵاتی هیچ گەل و میللەتێکی دیکەدا نەبێ، بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی یە، هەم پارێزگاری لێ کردنی ئەم ئەزموونەی ئێستای کوردستان و، هەم کامڵ کردنی و نەهێشتنی کەم و کووڕی یەکانی و، هەم هێنانەدی قەوارەیەکی سیاسی تۆکمەو تەواو لەسەر بناغەی شەریعەتی ئیسلام بەئەرکی سەرشانی دەزانێ.[9]

خوای پەروەردگارو دادگەریش فەرموویەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ الحجرات: ١٣.

ئاشكراشە كە لەسەر هەق و دادگەریی پشتگیری کردنی گەل و میللەت شتێکی شەرعیی و پێویستەو هیچ پەیوەندی بە دەمارگیریی (تعصُّب)یەوە نیە کە بریتیە لەسەرخستن و پشتگیری لێ کردنی خەڵك و میللەت بەناهەق و لەسەر بنچینەی ستەم، وەك لەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبینرێ:

*(عن بنت واثلة بن الأسقع قالت: سمعت أبي يقول: قلت: يارسول الله! ما العصبية؟! قال: أن تُعينَ قَوْمَكَ على الظلم) رواه ابوداود.

*(من نصر قَومَهُ على غير الحق فهو كالبعير الذي رُدِّي فهو يُنْزَع بِذَنْبِه) رواه ابوداود.

**بیست و یەکەم:** ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی یە هەڵوێستی خۆی لەبواری هەڵس وکەوت و (تعامل)[10]دا لەگەڵ لایەنە سیاسی یەکانی کوردستان و عێراق و حکومەت و دەوڵەتانی دەوروبەرو جیهان دا، بەگوێرەی هەڵوێستی

---

[9] کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم) بۆ توێژینەوەی ئەو جۆرە مەسەلانە تەرخان کراوە، بڕوانە: چاپی دووەم/ ساڵی: ١٤١٩ك/ ١٩٩٨ز.

[10] چونکە لەڕووی مەبدەئی یەوە هەر ئیسلام هەق و ڕاستەو تێکڕای ئایین و بەرنامەو بیردۆزەکان بەهەڵەو ناهەق و کوفر دادەنرێن، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (..فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ..) یونس: ٣٢، وە شوێن کەوتووانیشیان پاش بەسەردا چەسپاندنی بنچینەی (تطبيق قاعدة) { چەسپاندنی مەرجەکان و لاچوونی بەرچەکان} - (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) هەمان حوکمیان هەیە.

ئەوان بەرانبەر بەئیسلامو مسوڵمانانو کێشە ڕەوایەکانیان بەگشتیو، خەڵکی مسوڵمانی کوردستانو ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە بەتایبەت، دیاری دەکات.

وە ئامادەیە کە لەسەر هێنانەدی ئامانجە هاوبەشەکان (الأهداف المشتركة) وەك پارێزگاری لێ‌کردنی خاکی کوردستانو، ئاوەدان کردنەوەیو، خۆشگوزەران کردنی خەڵکەکەیو، پاراستنی دینو ژینو کەرامەتو ماڵو سامانیان، دەستبار لەگەڵ هەرکەسو لایەنێکی دڵسۆز بەگەلو وڵاتەکەی بگرێ.

چونکە خوای دادگەر و کاربەجێ فەرموویەتی: (لايَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) الممتحنة: ٨.

وە فەرموویەتی: (..وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ..) المائدة: ٢.

<u>بیستو دووەم:</u> ئەو کۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامی‌یە لەسەرخۆی بەپێویست دەزانێ کەشان بەشانی دەوڵەتو کۆمەڵو بزووتنەوەو تەوژمو کەسایەتی‌یە ئیسلامی‌یەکانی جیهان هەوڵ بداتو کاربکات بۆ بووژاندنەوەی ئۆممەتی ئیسلامو گێڕانەوەی سەروەریی شەریعەت (سيادة الشريعة)ی خوا لەسەر تێکڕای نیشتمانی ئیسلامیو پێکهێنانی دەوڵەتو قەوارەیەکی ئیسلامیی فراوانو، بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەسەر سەرتاپای زەمین دا.

وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ) البقرە: ٢٠٨. وە فەرموویەتی: (وإن هذه امتكم أمةً واحِدة وأنا ربكم فاتقون) المؤمنون:٥٢.

وە فەرموویەتی: (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) المائدة: ٢.

وەفەرموویەتی: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) النور: ٥٥.

**بیست و سێیەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە بەکارهێنانی هەر هۆکارێکی شەرعیی (كُلُّ وسيلةٍ شرعية) بۆ گەیشتن بەئامانج و مەبەستە شەرعی و ڕەوایەکانی بەدروست و ڕەوا دەزانێ، وەك: بانگەواز، پەروەردەو فێرکردن و تەزکیە، ڕێکخستن و هۆنینەوە، فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە، خەباتی سیاسی و پێکەوە مەدارکردن (المداراة)[11]، مەشق و ئامادەسازیی، جەنگ و بەرەنگاربوونەوە..

چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ..) النحل: ١٢٥.

وە فەرموویەتی: (..يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ..) البقرة: ١٢٩.

وە فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ وَجَاهِدُوا فِي سَبِيلِهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) المائدة: ٣٥.

وە فەرموویەتی: (وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ...) البقرة: ١٩٠.

وە فەرموویەتی: (إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا) الكهف: ٨٤.

**بیست و چوارەم:** ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە لەڕووی دیسپلین (ضبط وربط)ی حیزبی‌یەوە زۆر تۆکمەو توندوتۆڵ و جیددی دەبێ و، بەهیچ جۆرێك لەهیچ کەسێك قبووڵ ناکات کە لەمەرجەکان (شروط) و بنەما شەرعی‌یەکان و

---

[11] دیارە میکانیزم (آلیة) ی ئەو خەباتە سیاسی و پێکەوە مەدارکرنە بەپێی هەل و مەرج و بارودۆخە جیاجیاکان دەگۆڕێ و، بوارێکە (إجتهادات)ی جیاواز هەڵدەگرێ و لەگەڵ پاراستنی ئەسڵی: دانەبەزین لەبنەما گرنگ و گەورە شەرعی‌یەکان (عدم التنازل عن الأصول الشرعية المهمة)، بنچینەی: بەرژەوەندی‌یەکان و زیانەکان (المصالح والمفاسد) زیاتر حوکمی بەسەردا دەکات.

هێڵە گشتی‌یەکان‌و بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆی لابدات‌و، ڕێگا بەهیچ کەس نادات تاکڕەوانە ڕەفتار بکات، وە بەهیچ شێوەیەك‌و بەهیچ پاساوێك ڕێ بەماڵ ماڵۆکێنەو (تکتُل)و سەرپێکەوەنان‌و چپەچپ نادات‌و، ئامادەشە دەست بەرداری هەر ئەندامێکی گەورە یان گچکە ببێ کە ناتوانێ پابەندی بەرنامەو پەیڕەو بێت‌و، واز لەوجۆرە ڕەفتارانە بهێنێ، چونکە بێگومان دەست بەرداربوون لەئەندامێکی لارو لاسار زیانی کەمترە لەتێچکوون‌و شیرازە پچڕانی سەرجەم کۆمەڵەکە.

خوای کاربەجێش فەرموویەتی: (إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) النور:٥١.

وە فەرموویەتی: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا) الأحزاب: ٣٦.

وە فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ، وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) الأنفال: ٢٤-٢٥.

**بیست‌و پێنجەم**: هەر کاتێك قیادەی ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یەو بەر لەهەمووی کەسی یەکەم (الشخص الأول) کە ئەمیرو چاوساغی کۆمەڵەکەیەتی، بەو بنەما شەرعی‌یانەوە پابەند بوو بەپێی ئەو هێڵە گشتی‌یانە هەڵس‌وکەوتی کردو ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام دا، ئەوە لەسەرەتاوە متمانەو باوەڕ (ثقة) ی بێ دوو دڵی (تردّد)و بەڵێن‌و پەیمان (البيعة والعهد) لەگەڵ بەستنی‌و پاشان ڕێزو حورمەت گرتنی‌و گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی (السمع والطاعة) بۆ کرانی لەسەر ئەو ئەندامانە پێویست دەبێ کە ئامادە بوو ون بچنە ڕیزی ئەو کۆمەڵەوە کە ئەو قیادەیە سەرپەرشتی دەکات‌و ئەو برا گەورەو چاوساغە پێشەوایەتی دەکات، وە بێگومان پێویستە ئەندامانی هەر ئۆرگانێك بەگیان‌و دڵ‌و بەپێی توانا مادام ناشەرعیی نەبێ، گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی بەرپرس‌و سەرەوەی خۆیان بکەن.

خوای دادگەریش فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ الفتح: ١٠.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **(إِنَّ مِنْ إِجْلالِ الله إِكْرامُ ذي الشَّيبةِ المسلم وحامِلِ القرآن غير الغالي فيه ولا الجافي عنه وإكرام ذي السُّلطانِ المُقْسِط)** رواه البيهقي والبخاري في الأدب المفرد وابوداود عن ابي موسى الأشعري رضي الله عنه.

## جا بەڕێزان!

ئەندامان و موجاهیدە وره بەرزو ماندوو نەناسەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی، ئەو بیست و پێنج بنەما شەرعیی و هێڵە گشتییانەی کە ڕابردن بەئەزموون و تێگەیشتنی بەندە گرنگترین و سەرەکیترینی ئەو مەرجانەن کە بۆ بزووتنەوەو کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕاست و ڕەسەن پێویستن و، لەخوا دەپاڕێمەوە کە یارمەتیمان بدات بزووتنەوەکەمان لەسەر بناغەی ئەو بنەما شەرعییانە ڕاست بکەینەوەو بیکەینە کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی وا کە ناوی (ئیسلامیی) لێ خەسار نەبێت و بتوانێ مەبەستە شەرعییەکان (المقاصد الشرعية) ی جێبەجێ بکات و، هەم سەربەرزیی و عیززەتمەندیی دنیاو هەم بەهەشت و ڕەزامەندیی خواش بۆ ئەندام و موجاهیدەکانی و خەڵك و کۆمەڵگاش مسۆگەر بکات.

